زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

(١)

# عومەیری کوڕی سەعد

حبيب محمد سعيد

١٤٠٠ک - ١٩٨٠ ز

زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

(١)



# عومەیری کوڕی سەعد

حبیب محمد سعید

چاپخانەی
دار الرسالة ـ بغداد
١٤٠٠ك ـ ١٩٨٠ ز

# پێشکەش

پێشکەش بەو گەنجە خوێن گەرمانە ی کە ژیانیان تەرخان ئەکەن بۆ خزمەتی ئیسلام و بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان ئەخەنە پشت گوێ..

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين ، والصلاة والسلام على سيد المرسلين محمد وعلى آله وصحبه أجمعين .

لەم ڕۆژانەدا کەبیرو هۆشی بێ هێزو پێزی ڕۆژئاوا لەناومانا بڵاو بۆتەوەو مێشکی ڕۆڵەی موسلمانانی بەنج کردووە ، زۆر پێویستیمان بە ژیانی ئەو مەردە پاڵەوانانە هەیە لە پێشەوایانی ئیسلام بەتایبەتی گەنجەکانیان تا بەوێنەی مرۆڤی ڕاستەقینە شوێن پێکانیان هەڵگرین .

زانیاری دەرونیی ڕۆژئاوای خوانەناس بەشێک لە تەمەنی مرۆڤ ئەخاتە ئەولاوە کەگوایە لە

حلوەی کە نجێتیدا ـ فترة المراهقة ـ مرۆڤ بلوە بەسەر کزمەڵەوە . . ئاوور ناداتەوە بەلای ئەرکەکانی سەرشانیەوە . . خۆ ویستنی زۆر زۆرە .. تەنهـــا خۆیەو بەرژەوەندیـــەکانی ئەبینێت . . ژیانی دانەمەزراوو لارو ویر ئەبێت ..

لەراستیدا ئەمەژیانی ئادەمیزادی دەروون لارە . . ژیانی ئەو ئادەمیزادەیە کە بە پەروەردە شەیتانیەکان پەروەردە کرابێ . ژیانی ئادەمیزادی ژیر سێبەری پەروەردەی ئیسلامی هەمووی هەر تێکۆشانە .. هەمووی هەر دلسۆزی و هەســـت بە ئەرکی سەرشان کردنە ، بە منالی ، بەکەنجی ، بە پیاوی وە بەپیری .

پەروەردەی ئیســـلامی وەهـــا پەروەردەی ئەندامەکانی ئەکات ، ساتێ دەست بەرداریان ئابێت .. نابێ ساتێ لەژیانیان بە فیرۆ بروا . .

نابێ ساتێ بەرژەوەندی مرۆڤایەتیان لە یاد بچێ.ـ
بۆیە ژیانی مرۆڤی موسلمان بریتیە لە دڵسۆزیەکی
هەمیشەیی و کۆتایی نەهاتوو بۆ بە دەست هێنانی
بەختیاری وئاسایش و حەسانەوە بۆ مرۆڤایەتی .
ئەم باسـەی لە بەر دەستمانایە ژیانی مەردێکی
قارەمانە لەپێشەوایانی ئیسـلام و هاوڕێیانی پێغەمبەر
ﷺ کە ئەویش (عومەیر کوڕی سـەعدە) ـ خوا لێی
ڕازی بێت ـ کە نموونەی گەنجێکی دڵسۆزو
کاربەدەستێکی خۆنەویستە .. هیوا دارم خوای
زاناو بە توانـا کۆمەکی بکات تا بە پێنووسـە
لاوازەکەم شتێك بخەمە بەردەستی خوشك و برا
موسلمانە کوردەکانم بەڵکو ببێت بە چرایەك لە
چراکانی ڕووناك کردنەوەی ژیانمان بەیارمەتی
خوای گەورە .

نوسەر
٤ی/ڕەمەزان/١٣٩٨ ی کۆچی

# - ١ -

خوای گەورە ویستی وابوو عومەیر کوڕی سەعد هەربەمنالی باوکی بێدەرامەت و بێ سامان بەجێی بهێڵێ و هەتیو بکەوێ .. وەوای ڕێك خست کە دایکی شوو بکات بە یەکێ لە پیاوە دەولەمەندەکانی تیرەی ئەوس لە شاری یەسریب کەناوی جولاس کوڕی سوەید بوو .

جولاس لەپاڵ دەولەمەندیەکەیا پیاوێکی دڵ فراوان و خاوەن بەزەیی و چاودێری کەرێکی دڵسۆز بوو بۆ عومەیر ، بەمە عومەیر هەتیوی و بێ باوکی لەبیر چووەوە هەروەك جولاس عومەیری بە کوڕێکی زۆر خۆشەویستی خۆی ئەزانی ،

عومەیریش بەو شێوەیە جولاسی خۆش ئەویست .

ڕۆژان تێپەڕین .. بەرەبەرە عومەیر گەورە بوو ، هەرچەندە عومەیر گەورە تر ئەبوو جولاس زیاتر خۆشی ئەویستو لە دڵیا جێگای ئەبووەوە . چونکە عومەیر لە هەموو هەڵسوکەوتێکیا دەرئەکەوت کە خاوەنی ژیریو زیرەکیەکی بێ ئەندازەبوو ، ئینجا بادەستپاکیو ڕاستگۆییەکەی لەولاوە بوەستێ .

ئاینی ئیسلام دەستی کرد بەبڵاوبوونەوە .. کۆمەڵی موسلمان بنکەی بتەوی بۆ خۆی دامەزراند ،تا بە سەربەستی لەژێر سایەی قورئاندا خواپەرستی خۆی بکاو ڕێبازی قورئان بە مرۆڤایەتی بکەیەنێ..

عومەیری کوڕی سەعدیش تەمەنی تازە لە دەساڵی تێپەڕی بوو ، موسلمان بوو . . بووە ئەندامێکی تازەپێگەیشتووی کۆمەڵکەی ئیسلام

.. هێشتا هیچ جۆرە بیروبڕوایەك لە ناو دڵە ناسکەکەیدا جێگای نەکردبۆوە و بەسەپێتی مابۆوە تا بیرو بڕوای ئیسلامی بۆ کەردی کەیشتیو بەجوانی وڕێك و پێکی تیایا جێگیر بوو . ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بڕوای خوایی لەناویا ڕیشەی دائەکوتا. هەر بەومنالیە لە هیچ نوێژێك دوا نەئەکەوت ، وە ئەبوایە لە پشت سەری پێغەمبەری خۆشەویستەوە بە کۆمەڵ ( جاعەت ) بەجێی بێنایە . دایکیشی کە چاوی بە کوڕە تازە پێ کەیشتووەکەی ئەکەوت کەوا بەومنالیەوە واخۆشەویستی ئیسلامو خۆشەویستی پێغەمبەرەکەی چۆتەدڵیەوەو بۆ نوێژکردن لەکەڵ جولاسی مێردیا هاتوچۆی مزکەوتی ئەکرد ، زۆر دڵی ئەکەشایەوەو شادمان ئەبوو ..

لەمکاتەدا دڵکەرمیەك کەنجەکانی مەدینەی

کرابوو.. بە هیچ شێوەیەك خۆیان نەئەهات بەبەردا ، تەنها خەریکی خواپەرستی و لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز ئەبوون ، هەموو ئەندامیان کردەوەی سوود بەخش و رەوشتی بەرز بوو . خۆ لە کاتی جیهادیشا ، بە پێچەوانەی گەنجە پەروەردەکراوەکانی بەرنامە شەیتانیەکانەوە ، هەر یەکەیان حەزی ئەکرد بەشداری ئەو ئەرکە پیرۆزەی بکردایە با بە تەمەنیش منال بوایە ..

هومەیریش ، هەروەك گەنجێکی موسلمانی ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی ژیانی خواپەرستی پڕ ئارام و حەسانەوەی ئەدایە سەر ، دوور بوو لە دوودڵی و دڵەتەپێ و نەخۆشیە نەفسیەکانی کۆمەڵگەی نەفامی ، هەتا خوا وای لێ وابوو کاتێ کە پێ گەیشت تووشی تاقی کردنەوەیەکی زۆرگران ببێت ، تاقی کردنەوەیەك کەکەم کەس شتی وابێتە رێی و جگە

له بڕوا دامەزراوەکانیش کەس تیایا دەرنەچێ ..

ئـەوەبوو لە ساڵی نۆیەمی کۆچیدا پێغەمبەری خـــوا - ﷺ - بڕیـاریدا بچێت بـەکــژ ڕۆمەکاندا لە تـەبوك (١) ، وە فـەرمانیدا هـەر موسـلمانێ دەسق چەك ئەکرێ ئامادەی ئەو جەنگە ناهەموارە ببێت ..

لە هێرشـــەکانی تردا پێغـەمبـەری خـــوا - ﷺ - ڕاسـتەوخۆ نیـازی خۆی دەرنەئـەبڕی بۆ هەموو لەشکر ، چونکە شاری مەدینە کە وەك پایتەختی یان بنکەی ئیـسلام بوو ، لەولاشـەوە دوو ڕووەکان هەموو هەواڵێکیان ئەکەیاندە ،

---

(١) تەبووك ئەوسـا شوێنێك بوو لە سـەر سـنووری شامو بەدەسـت ڕۆمەکانەوە بوو ، ئێسـتە شارێکەو سـەربەوڵاتی عـەرەبی سعودیە .

دوژمنانی ئیسلام ، لەبەرئەوە جگەلەچەند کەسێکی کەم کەس ئاگادار نەئەکرا .. بەڵام لە جەنگی تەبووکدا ڕاستەوخۆ لای خەڵکەکە ئاشکرای کرد ، لەبەرئەوەی هەموو کەسێ ئاگادار بێ و خۆی ئامادە بکات بۆی . چونکە جەنگی تەبووك بریتی بوو لە بەگژا چوونی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی .. زۆر دوور بوو ، وەناڕەحەتی و تەنگاوی لەوپەڕی پلەدا بوو ..

جا هەرچەندە ئەم ڕووداوە لە وەرزی هاویندا بوو ، گەرما تینی سەندبوو و بەرو بووم پێ گەیشتبوو و سێبەر خۆش بوو بوو و لەبەر گەرما خەڵکی هێزو تینی لا نەمابوو ، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا موسلمانەکان هاتن بەدەم بانگەوازی پێغەمبەرەکەیانەوە و دەستیان کرد بەخۆ ئامادەکردنو خۆ پێچانەوە . چونکە لای مرۆڤی خاوەن بڕوا ئە و

کۆسپانە هیچ دەورێکیان نیە و ناتوانن ویـــۆق سارد بکەنەوە .. بەڵام هەندێ لەو مرۆڤانەی کە تەنها بەدەم موسلمان بوو بوونو دڵیان بە تیشکی بڕوا ڕۆشن نە بووبۆوە ، دەستیان دایە پڕو پاکاندە دژی پێغەمبەرو لەشکری ئیسلام تاخەڵکی دڵسارد کەنەوە.وەگومان و دوودڵیان بڵاو ئەکردەوە تاکۆمەڵی تەمەڵی دانیشتوو زۆر ببێت و دوو ڕوویی ئەوان دەرنەکەوێ . وە لەو شوێنانەدا کەترسیان نەبوو کە پێغەمبەرو موسلمانەکان پێیان بزانن ، وتەی وەهـــا نـەهات بەدەمیانـا بەجارێ لەڕیزی موسلمانەکان دەری ئەکردنە دەرەوە پڕو پاکاندەکانیان وەها کاریگەربوون ' زۆر لەموسلمانە دڵسۆزەکانیش شەیتان چووبووە بن کەلیەیانو دڵیان سارد بوو بۆوە ..

چەندڕۆژێ بەر لەوەی کە لەشکری موسلمانەکان

لەمەدینەوە بەرەو تەبووك دەرچێ عومەیری کوڕی سەعد - کە هێشتا منال بوو - دوای بەجێهێنانی نوێژ لە مزگەوت گەڕایەوە مالەوە ، بەلام بە دلێکی شادمانەوە ... بەدەروونێکی بەرزەوە .. چونکە لە مزگەوت بەچاوو گوێی خۆی لێبڕان و چاونەترسی وسەروومال نەویستی موسلمانەکانی دیو بیست ..

چاوی لێ بوو ئافرەتە ئەنصارەکانو موهاجرەکان تەماتە خزمەتی پێغەمبەرو - ﷺ - هەرچی ئالتونێکیان پێوە بوو دایان ئەمالیو ئەیانخستە بەردەمی ، تا بە نرخەکەی لەشکری - جیهادی ئیسلامی - بەڕێ بکاو بینێریتە مەیدانی خوێنڕشانو سەختکارانەوە . عومەیر چاوی لێبوو کە عوسمانی کوڕی عەففان توورەکەیەکی هێنا هەزار دینار ئالتونی تیابوو و

پێشکەشی پێغەمبەری خوای کرد .

وە بەچاوەوە بوو کە عەبدوالرەحمان کوری عەوف دووسەد ئوقیە ئالتونی دابوو بەسەر شانیاو ٩٠٠ هێنای خستیە بەردەم پێغەمبەری خۆشەویست .

هەتا چاوی لێبوو یەکێ لە موسڵمانە هەژارەکان نوێنەکانی هێنا بۆ فرۆشتن هەتا بە نرخەکەی شمشێرێك بکرێتەوە لە رێی خوادا پێی بجەنگێ .

عومەیر ئەمانەو زۆری تری دی .. راستەوخۆ بروای کرد کە راستە کۆمەڵکەی ئیسلامی بەسەرو ماڵەوە لێ ئەبرێ و هەموو کرانبایەکی لا بێ نرخەو بەوپەری سنگ فراوانیەوە لەرێی خوادا بەخش ئەکات .. چونکە ئاوات و ئامانجی کۆمەڵکەی ئیسلامی راستەقینە ، دەستکۆتا کردنی ستەمکارانەو لەناوبردنی بیروباوەرو بەرنامەی پرو پووچ و رزگارکردنی مرۆڤایەتی یە لە

ژێر ڕکێفی ئەو دەستبڕە خوێنمژانەی کە خۆیان کردووە بە خوای مرۆڤایەتی بەوەی کە بە نەزانی نەخشـەی ژیانیان بۆ ئەکێشن ، جا موسلمانان بەرامبەر بەم ژیان تەرخان کردنە تەنها بە تەمای پاداشتی خوان ، بەوەی لێیان خۆش بێ ولە سزای بەئازاری دۆزەخ ڕزگاریان بێ وە بە بەهەشتی بەرین بکەن ..

عومەیر بیری لە هەڵوێســـتی بەرزو پیرۆزی موسلمانان ئەکردەوە ، کەچی سەری سوڕ ئەما لە جولاسی زرباوکی کەوا بەهیچ شێوەیەك ناجوڵێ و خۆی ئامادەی مەیدانی جیهاد ناکات ، وە لەگەڵ ئەوەشدا کە دەست ڕۆیشـــتوو بوو هیچی نەئەبەخشی لەڕێی خوادا ..

کاتێ کە لە مزگەوت گەڕایەوە دەستی کرد بە گێڕانەوەی دەنگ و باسی مزگەوت ، تا بەڵکو

غیرەتی جولاسیش بجوولێ و خۆی هەکۆبکاتەوە و هەرچی لەتوانایا بێت بیبەخشێ ، چونکە کۆمەڵێك موسلمانی هەژار هاتنە خزمەتی پێغەمبەر - ﷺ - داوایــان لێ کرد کۆمەکیان بکات تا بتوانن ئەوانیش بەشداری جەنگی ڕۆمەکان بکەن ، بەڵام پێغە مبـەری خوا ﷺ - هیچی لا نـەمابـوو تا ئـەوانیش بخاتـە ڕێ ، بۆیە بە گریانەوە گەڕانەوە لەداخی ئەوەی کە هیچیان شك نەئەبرد تا بەشداری جهاد بکەن و ئارەزووی شەهیدی دڵیان دامرکێنێتەوە(١)..

---

(١) موسلمانە دەست کورتەکان حەو کەس بوون کە ئەمانەن .:.

(١) سالم کوڕی عومەیر . ٢ - عولبە کوڕی زەید ٣ - عەمر کوڕی غونمە .

٤ - سالم کوڕی هەرەمی کوڕی عەمر =

جولاس لەبانی ئەوەی بەوێنەی موسلمانێکی
دڵسۆز و بەغیرەت هەڵسێ و خۆی کۆبکاتەوەو
بکەوێ بـە دوای هەزارە دەست کورتەکانا
کەتوانایان نیە بکەنە مەیدانی جەنگ ، تادەست
گرۆییان بکاو بیانخانە ڕێ ، بۆ بەرز کردنەوەی
ئالای ئیسلام و پەرچ دانەوەی ئینۆکی ئەوخوێن
مژانەی کە بەشێکی زۆر لە کەلە داماوەکانیان
کردبووە بەندەی ئەڵقە لە گوێی خۆیان . بۆ
ڕزگار کردنی ئەو کەلە بەستەزمانانەی ژێر
چەپۆکی ڕۆمانیـە ڕەگـەزپەرستە بێویژدانە
خوێنمژەکان ، وە حەسانەوەیان لەژێر یاسا
بێ کەردەکەی قورئانا . کەچی جولاس بەجۆرێ

--- 

= ٥ ـ ئەبولەیلای مازنی .

٦ ـ سـلەلە کوڕی صەخر . ٧ ـ عرباض کوڕی ساریە .

وەلامی عومەیری دایەوە بەهیچ شێوەیەك نەهاتووە بە بیریاکە موسڵمانێك شتوا بێت بەدەمیا کەوتی [ ئەگەر محمد ڕاست بکاو پێغەمبەری خوابێت ، ئێمە لە کەر خراپترین ] .

عومەیر تێ کەیشت ئەم وتەیە بۆ جولاس بەسە تا لە ڕیزی موسڵمانەکان دەری کاتە دەرەوە ، عومەیری هەژار چی بکات باشە ؟ ...

عومەیر لە بیریەتی چۆن جولاس زیاترو باشتر لەباوك چاودێری ئەوی ئەکردو چۆن ئەوپەڕی پلە خۆشی ئەویست و ڕێزی ئەکرت . هەموو شاری مەدینەش ئاگاداری ئەو پیاوچاکیو چاودێریە دڵسۆزانەی جولاسن و ئەگەر عومەیر ئەم هەڵەیەی جولاس بکەیەنێ و ئاشکرا بێ دانیشتوانی مەدینە بە سپلەو بەدنمەکی ئەدەنـە قەڵەم ؛ لەولاشەوە عومەیر خۆی بە موسڵمان ئەزانێ و یەکێکە لەو

گەنچە خوێن گەرمانەی کە گۆمەڵگەی مەدینەی
موسلمان پێیان ڕازاوەتەوە . خۆ ئەگەر ئەم
وتەیەی جولاس نەگەیەنێ ، ئەوە ناپاکیە لەگەڵ
خواو پێغەمبەری خوادا ، وە وەکو ئەوە وایـــە
لەڕێبازی قورئان پاشگەز بووبێتەوەو چووبێتە ڕیزی
دووڕووەکانەوە . لەم بەینەدا داماوگیری خوارد .
چی بکا باشە ؟ ... منالێکی دە دوانزە سـال ،
ئەبێ بە تەنیا چۆن بیر لەم گیرو گرفتە بکاتەوە؟..
ناپاکی لەگەڵ ئیسلامدا زەرۆمەندی هەردوو
جیهـانی ئـەکات . وە وتنـی وتـەی جولاس و
دەرخستنی لەناو خەڵکا ، بەبەدنمەکی دەرئەکا ،
تا یەکێ ئەڵێ ڕاست ئەکا چەند کەسێ ئەڵێن
بۆی هەڵبەستووە ، هەرکامیانی بیر لێ ئەکردەوە
هەر تاڵ بوو ، بۆیە خێرا یەکێکیانی لە دڵا
بڕیار داو خێرا دوای ماوەیەکی کەم لە وتەکەی

جولاس وەڵامی دایەوە :

« بە خوا ئەي جولاس لە سەر ئەم زەویەدا جگە لە موحەممەد کوڕی عەبدوللا کەسێ تر نە بووە لە تۆ خۆشترم بوێت . بەڵکو تۆ خوشەویستترین و دڵسۆز ترین و بە خشـندارترین کەسی بۆمن وەتۆ قسە یەکت کرد ئەگەر باسی ئەکەم تۆ پێ ی ئەشکێنیت ، وە ئەگەر ئەیشارمەوە ناپاکیە لە گەڵ سپاردە کە مدا وە بە خۆم و ئاینمەوە تیا لەچم ، جا تۆ بیرێ لە خۆت بکەرەوە » .

* * *

گە نجی دل موسلمان ، عومەیر کوڕی سەعد ، بەرەو مزگەوت کە وتە ڕێ ، لەوێ ئەوەی لەجولاس کوڕی سوەیدی بیستبوو گەیاندی بە پێغە مبەری خوا - ﷺ - .

پێغـە مبـەر - ﷺ - عومـەیری لاي خۆی

هێشتەوە و یەکێ لە هاوڕێکانی نارد بە دوای جولاسدا ئەوەندەی پێ نەچو جولاس هات و سەلامی کرد لە پێغەمبەر ـ ﷺ ـ ئەویش لێی پرسی :

ئەو قسەیە چییە کە عومەیر کوڕی سەعد لێتی ئەگێڕێتەوە ؟ ئینجا وتەکەی فەرموو .

جولاس وتی : درۆم بۆ هەڵئەبەستێ ، ئەی پێغەمبەری خوا هیچێ لەوە بەدەما نەهاتووە ـ ئەو هاوڕێ یانەی کەلەوێ ئامادە بوون هەریەکەیان پێی خۆش بوو بۆی دەرکەوێ بزانێ جولاس و عومەیر کامیان ڕاست ئەکەن ، بۆیە هەولیان ئەدا ڕاستی و ناڕاستی لەدەم و چاویانا بخوێننەوە ئینجا بە چپەوە کەوتنە وتوویژ .

یەکێ لە دڵنەخۆشەکان وتی : چ کوڕێکی

لاساره ، ئەیەوێ ئاوا پاداشتی بداتەوە ...

هەندێ تر وتیان : بەڵکو ئەمە منالێکە بە خواپەرستی کەورە بووە ، بە شێوەی دەم و چاویا وا دەرئەکەوێ کە ڕاست ئەکا .

پێغەمبەر - ﷺ - ئاوڕی دایەوە بۆلای عومەیر دی وا دەموچاوی سوور بۆتەوە و فرمێسك لە چاوەکانی دێتە خوارەوەو ئەڕژێتە سەر کولمو سنگی و ئەڵێ :

- خوایە ڕوون کەرەوەی ئەم وتەیەم بنێرەرە خوارەوە سەر پێغەمبەرە کەت ...

چاوەڵاس لە ترسی ئەوەی قورئان بێتە خوارەوە وە وەك چەندەها ڕووداوی تر - ڕاستی عومەیرو ناپاکی ئەو دەربخات ، بەتوندی هەستایە سەرپێ و وتی :

ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەوەی من بۆتم گێڕایەوە هەرئەوە ڕاستە ؛ ئەگەر پێت خۆش بێت هەردووکمان سوێندت بۆ ئەخۆین ، وە من سوێن ئەخۆم بە خوا کەوا هیچن لەوەم نە وتووە کە عومەیر بۆ تۆی گێڕاوە تەوە .

هەر کە جولاس لە سوێنەکەی بووەوە ، خەلکی ڕوویان کردە عومەیر تا بزانن هەڵوێستی ئەو چۆنە لە سوێن خواردنا ، تۆ بڵێی خۆی بە ڕاست بزانێو بوێرێ سوێن بخوا؟ داخۆ چی بکا ؟

لەم کاتەدا پێغەمبەر -ﷺ- ئارام وبێ دەنگ بوو هاوڕێیان زانیان کەوا وەحی دێتە سەر ، بۆیە لە شوێنی خۆیانا بێ دەنگ دانیشتن چاویان بڕیبوە پێغەمبەری خوا .

لێرەدا جولاس ترس ولەزر دایگرتەوە و عومەیریش پەلەی بوو هەواڵی تازە بزانێ ، زۆر حەزی ئەکرد ئەنجامیان دەرکەوێ ، خەڵکەکەش هەروا مانەوە هەتا وەحی تەواو بوو ، پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - فەرمایشتی خوای بۆخەڵکە کە خوێندەوە کە تیایا ڕاستی عومەیر و ناپاکی جولاسی دەرئەخست کە جولاس ئەو سوێندەی بە ناڕەوا خواردو ئەو وتەیەی عومەیر لەدەمیەوە گێڕایەوە ڕاستە وتوویەو جولاس دوای موسلمان بوون کافرو بێ ئیمان بوویە وە ، کە ئەفەرموێ :

« یَحلِفون بالله ما قالوا ، ولقد قالوا کلمة الکفر وکفروا بعد اسلامهم وهمُّوا بما لم ینالوا وما نَقَمُوا إلاّ أنْ أغناهم اللهُ ورسولُهُ من فضله فإن یتوبوا یكُ خیراً لهم وإن یتولّوا یعذبهم الله

عذاباً أليماً في الدنيا والآخرة وما لهم في الارض من وليّ ولا نصير » (١) .

بەڵام خوای خاوەن سۆزو بەزەیی هەردوای ئایەتەکە ئەمەشی ناردە خوارەوە هەتا یاسا بێ بـۆ هەموو سەرانێ شێواوێکی وەك جولاس کەوا کەڕانەوەیان لێ وەرئەگیرێت بەڵام ئەگەر پشـتە هەڵکەنو نەگەڕێنەوە خوا ئازاروسزایەکی پڕژانیان ئەدات ..

جولاس کاتێ کوێی لەقورئانی پیرۆز بوو بە تایبەتی لە بارەی ئەوو هومەیرەوە هاتە خوارەوە بۆ دیاری کردنی ئەویان کەڕاست بێژە ، هەموو گیانی هاتە لەرزە .. کەی ئەمە ئەهات بە خەیالیا بەم تاقە وتەیە ئاوا ناوی بزرێت و پەردە لەسـەر دەروونە لە خێ ، براوەکەی لابرێت ؟ خەریك

(١) سورەتی ( التوبة / ٧٤ )

بوو لە ترسانا زمانی بەستری ئینجا ئاوڕی دایەوە بۆلای پێغەمبەری خواو وتی :

بەڵکو ئەگەڕێمەوە بۆ لای خوا .
ئەی پێغەمبەری خوا ، بەڵکو ئەگەڕێمەوە . .
عومەیر ڕاستی ووت ، ئەی پێغەمبەری خوا ، وە من لە درۆزنەکان بووم ؛ داوا ئەکەم لە خوا ئەم گەڕانەوەیەم لێ وەرگرێ .. بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا ...

بە جارێ جولاس چاوی شەیتانی کوێر کرد ، ماوەیەکی زۆرە هەوڵی لەگەڵ ئەدا و دەربارەی ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام وەسوەسە ئەخاتە دڵیەوە .. ماوەیەکە لێ بڕاوە بۆ ئەوەی لە خشتەی بەرێ و لە کاروانی پڕ بە ختەوەری خاوەن باوەڕان دوای بخات و بەهەشتی بەرینی لەدەست بدات .. وە ئەو دوو ڕوانەش

له مزگەوتا بوون و بەچاوی خۆیان بەلگەیەکی تری پێغەمبەریان بۆ دەرکەوت و هەر لەسەر دڵ پیسی و ناپاکی خۆیان مانەوە ، بە یەکجاری مۆری نەکبەتی نرابەسەر دڵیاناو زیاتر دڵیان ڕەش بوویەوە .

دوای گەڕانەوە و پاك بوونەوەی جولاس پێغەمبەری خۆشەویست — ﷺ — ڕووی کردە عومەیری گەنجی دڵو دەروون موسڵمان ، سەیر ئەکا فرمێسکی شادی دەموچاوە بەباوەڕ کەشاوەکەی تەڕکردووە .

ئینجا پێغەمبەری خۆشەویست - ﷺ - دەستی پیرۆزی درێژ کرد بو گوێی عومەیرو گرتی وفەرمووی :

( وَفَتْ أذنك - ياغلام ما سمِعتْ ، وصَدّقَكَ رَبك ) واتە :

گوێت وەفای خۆی بردە سەر لەوەی بیستبووی - کورم - خواش بەراستگۆی دەرکردی .

بەراست گۆیی و دڵسۆزی عومەیر ، جولاس خوا بۆی کردو کەڕایەوە سەر ڕێبازی ڕاستەقینەو بووەوە ئەندامێکی دڵ دامەزراوی ئیسلام وە بە ڕێك وپێکی ئەرکی سەر شانی خۆی بەجێ ئەهێنا ..

هاوڕێ یانی پێغەمبەر هەستیان بەدڵ دامەزرواوی جولاس ئەکردو ئەیانزانی بەجوانی لێبڕاوە بۆ ئیسلام ، وە لە جیاتی ئەوەی ڕقو قین لە عومەیر هەڵگرێ ، بە پێچەوانەوە لە بەخشش بێبەشی نە ئەکردو لە جاران زیاتر خۆشی ئەویست ، وە هەر کاتێ ناوی عومەیر ببرایە ئەیوت : خوا پاداشتی چاکەی بداتەوە ، منی لە خوا

ئەو ناسی ڕزگار کردو لە ئاگری دۆزەخ لای دام .
بەم شێوەیە عومەیر بە پاکی و وەفاداری خۆی بووە
مایەی قازانج بۆ خۆی و بۆ جولاسیش کە لە
باوك زیاتر خزمەتی کردبوو . دیارە هەر کەسێ
لەگەل ئیسلاما وەفادار بێ ئیسلامیش بەری
شیرینی ئەو وەفاداریەی پێشکەش ئەکاتەوە ..

## ٢

عومەیر لەسەر باوەڕە پتەوە دامەزرا وەکەی
مایەوە هەتا پێغەمبەری خوا ـ ﷺ کۆچی
دوایی کردو لە دوای ئەو ئەبوبەکر ـ خوا لێی
ڕازی بێت ـ بە هەلبژاردنی موسلمانەکان
کاروباری دەولەتی ئیسلامی پێ سپێررا ، ئینجا
دوای ئەویش عومەر ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ

بووە جێ نشینی ئەبوبەکرو پایەی دەوڵەتی ئیسلامی دامەزراندو خاکی ئیسلام بەرە بەرە زیادی کردوو دەستە بە دەستە گەلە چەوساوەکان دەر ئە هێنران لە ژێر ڕکێفی دەست شەیتانیە چەپەڵەکانو ئەخرانە ژێر سێبەری ڕێبازی داد پەروەرانەی قورئانەوە..

لەم ماوەیەدا عومەر خەریکی گەیاندنی ئاینی ئیسلام بوو بە مرۆڤایەتی تا بە جوانی لە مەبەستی دروست بوونو مانو نەمانی خۆی تێ بگا ..

خەریکی گەیاندنی ڕێبازی ڕزگارکەر بوو تا مرۆڤایەتی لە سایەیا بحەسێتەوە ..

لەم کاتەدا گیر و گرفتێ ڕووی کردە عومەری خەلیفەی موسڵمانەکان ، ئەویش دانیشتوانی شاری ( حیمس ) بوون لە سوریا ، خەلیفە هەر کاربە دەستێکی بۆ ئەناردن پشتیان تێ ئەکردو بەشکات ورەخنە دایان ئەگرتەوە گوناهو کەموکوڕی زۆریان

بۆهەڵێەدا وەدەنگو باسیان ئەکەیاندە خەلیفە بەناواتی ئەوەی لای باو یەکێ تری چاکتریان بۆبنێرێت .

عومەر هەمیشە ئەگەڕا بەشوێن هاوڕێ دڵسۆزە خۆنەویستەکاناو بەزۆر کاروباری موسڵمانەکانی ئەدان بەسەرا . بۆیە ئەیفەرموو :

« پیاوێکم ئەوێ کەئەگەر فەرماندە نەبێ لەناو خەڵکابەفەرماندە بزانرێ وەئەگـەر فەرماندەبوو ، لەناویانا جیانەکرێتەوەو بەیەکێ لەوان بژمێررێ ..

« کاربەدەستێکم ئەوێ نـە لەجلو بەرگاو نـە لەخواردناونە لەخانووبەرەدا خۆی جیانەکاتەوە... لەناویانا نوێژبکاو ... بەیەکسانی شتیان بەسەرا بەش بکاو ... بەدادپەروەری فەرمانڕەوایی یان بکا.. وەدەرگا لەڕووی پێویستیەکانیانا دانەخاو هەمیشـە کراوەبێت » .

دیـارە گەورەی دڵسۆز بەهەموو توانەیەکیەوە

هەول نەداو ئەگەڕێ بزانێ کامە شیاوی ئەوەیە تا کاروباری موسلمانانی پێ بسپێرێ ، چونکە لەچاکەو خراپە کردنیانا ئەو خۆی لێ پرسراوە .

لــە لایەکی ترەوە هاوڕێ تێگەیشتووەکانی پێغەمبەری خوا - ﷺ - ئەیانزانی لێپرسراوی و کاربەدەستی و هەڵسوڕاندنی کاروباری موسلمانەکان چەندە ئەرکێکی گرانە ! مرۆڤی ئەوێ بتوانــێ یەکسانی و دادپەروەری لەبــیر نەچێ و ژیان و ڕابواردنی دنیا لەخشتەی نەباو خوای گەورەو سزای ڕۆژی دوایی لەبیر نەچێ . بۆیە بەهەموو شێوەیەك هەوڵیان ئەدا خۆیان لەو ئەرکە گرانەو تاقی کردنەوە ناهەموارە لابدەن ، نەوەکو نەتوانن بەجوانی پێی هەڵسن و خوای گەورەیان لێ بڕەنجێ ..

عومەر ناچار بــوو بگەڕێ بەدوای یەکێکدا کەدانیشتوانی حیمس نەتوانن تانەی لێبدەن . بیری

کردەوە سەرنجی دا لەناو کۆمەڵی هاوڕێیانا تەنہا ئەوی
عومەیر کوڕی سەعدی دەست کەوت .. تەنہا ئەوی
بەشیاوی کار بەدەستی حیمس ئەزانی . بەڵام عومەیر
لەمەدینە پاڵی لێ ئەداوەتەوە ، بەڵکو سەرکەرمی
ئیشی خۆیەتی .. سەرکەرمی جیہادە .. ئـــاڵای
قورئان بەسەر شارو دێہاتانەوە بەرز ئەکاتەوە ..
قەڵای ستەمو زۆرداری ئەڕوخێنێو کەلان لەسایەی
قورئانا ئەحەسێنێتەوە .. لە ( جەزیرە ) ی شـــام
بەسەرکردایەتی لەشکرەکەی لەگەڵ هێزی ئەفامیو
خوانەناسیدا ئەجەنگێ ..

عومەیر لەمحاڵەدایەو خەلیفەی موسلمانەکانیش
دەستەپاچە داماوە .. بۆیە ناچاربوو بانگی کاتەوەو
کاروباری حیمسی پێ بسپێرێ .. فەرمانی بەسەرادا
بکاتە شوێـــنی کـارەکەی .. عومەیر بەوێنەی
هەموهاوڕێیەك ئاواتەخوازی ئەمدەسەڵاتداریە نیە..

بجا هەرچەندە حەزی نەکرد کەخەلیفە وازی لێبێنێ
تابچێ بەدەم جیهادی خۆیەوە ، بــەڵام ناچاربوو
مل کەچی فەرمانی خەلیفە بێت ..

عومەیر کەیشتە حیمس‌و خەڵکەکەی بانگکرد
بۆنوێژێکی جەماعەت ، کاتێ لەنوێژ بوونەوە ،
دەستی دایە وتاردان . چاسوپاس‌و ستایشی خوای کردو
درودو سەلامی پێشکەش بەپێغەمبەری خۆشەویست
کردو ئینجا وتی:

« ئەی خەڵکینە ، ئیسلام قەڵایەکی سەختو
دەرکایەکی بەتینە ، وە قەڵای ئیسلام دادپەروەریە
ودەرگاکەشی حەق‌وڕەوایە . جانەگەر قەڵاکە
ڕوخێنراو دەرگاکە تێکشکێنرا ، یاساکانی ئەم
ئاینە ئەخرێنە پشت گوێ‌و هێزی ئیسلام لەناوئەچێ.
هەتا دەسەڵاتی ئیسلام بەهێزبێت ، ئەو هەر لەسەر
سەختی خۆی ئەمێنێتەوە بەڵام بەهێزی‌و دەسەڵاتی »

بریتی نیە لەلێدان بەقامچی، وە یا کوشتن بەشمشێر بەڵکو بریتیە لەچەسپاندنی دادپەروەری و شوێن کەوتنی حەق و ڕاستی » .

دوای ئەم وتارە پڕ کاکڵەیە چوو بەلای کاری خۆیەوە ، تائەو نەخشەیەی کە لەوتارە کورتەکەیدا بۆی کێشان بتوانێ جێ بەجێی بکات .. وتەکانی بکاتە کردەوە چونکە کۆمەڵگەی ئیسلامی ئەوسەردەمە تەنها بەوتەی لوسی بێ جێکە ڕازی نەئەبوون و دوای کەمێ وتەیان ئەکردە یەک و هاواریان لێ بەرز ئەبوەوە ، چونکە ئیمپریالیزمی خوانەناس نەخشـــەی وەوبەرەکی و دوژمنایەتی و بەرەلایی و خۆپەرستی و بێ گوێیی بۆ نەکێشابوون .

بەڵێ ڕۆژان ڕابوردن و عومەیر ساڵێکی تەواو لەحیمس مایەوە ، لەماوەی ئەم ساڵەدا هیچ نامەو دەنگو باسێکی نەنارد بۆخەلیفە وە نەدرهەمێک و

ئەدینارێکی لەخەراج و دەستەهاتی ئەوناوەی ئەنارد بۆ پایتەخت . لێرەدا دوودڵی و گومان لای عومەر دروستبوو ، چونکــە ئەیزانی هێزی راکێشانی خۆشیانی ئەم جیهانە زۆر بەتینە لەســەر دەروونی مرۆڤ ، وەهەر کەسێ بەتەواوی پەروەردەی ئیسلامی وەرنەگرتبێ توانای نیــە خــۆی لەبەردەم ئەورەشەباناڵەبارەدا بگرێ ، وەخۆی و بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی لەبیربچێتەوە ، بۆیە هیچ موسلمانێکی شارەزا لەئیسلام چاوەڕوانی دڵسۆزی و پیاوەتی و دادپەروەری ناکات بێجگە لەوانەی کە بە پەروەردەی ئیسلامی پەروەردەکراون وەئەگەر چاکەیەکیشیان لەدەست دەرچێ ئەوە پاشماوەی باوەڕە لە دڵیانا ماوەتەوە واویژدانیان ئەجولێنێ کەچی بەخۆیان نازانن .. عومەر ئەترسا عومەیریش دڵی چوبێتە سەرابواردن و دەسەڵات گومرای کردبێ ، چونکە

بەلای ئەوەوە تەنها پێغەمبەری خوا ﷺ پاكو پێکەردەو دەرونی لەرمان بەخراپە نادات ...

بۆیە بەنووسەرەکەی وت بنووسە بۆ عومەیر کوڕی سەعد . پێی بڵێ ئەگەر نامەی گەورەی موسلمانانت بەدەست گەیشت شاری حیمس بەجێ بێلەو وەرەوە بۆلای ، وەهەرچی خەراجو دەستهاتی موسلمانانت کۆکردۆتەوەلەگەل خۆتا بیهێنە ..

موسلمانی خۆنەویستو کاربەدەستی دلسۆز نامەی خەلیفەی پێگەیشت ناچاربوو خۆی بپێچێتەوەو بەرەو مەدینەبکەوێتە ڕێ ... بەلام چی بپێچێتەوەو چۆن بکەوێتە ڕێ ؟

توێشووی نانەکەی و قاپی چێشتەکەی و جەوەندەی قاوخواردنەوەو دەستنوێژەکەی هەلگرتو داتی بەشانیەوە حەربەکەی گرت بەدەستەوەو بەپێی تەنیا ، بەپێ !... دانیشتوانی حیمسی بەجێ هێشتو بەرەو

مەدینە بەناو لمی بیابانی شام و نەجدا مەنک...
ئەنا ... لەم گەشتە دوورو درێژەدا عومەیر ئووش...
ماندوبونێکی زۆر بوو . هەتا ڕەنگی زەرد بوو ...
لەشی لاواز بووو تووکی سەری درێژ بوو وەسەراپا...
تۆزی گەشتێکی دورو درێژی لێ نیشت ...

کاتێ عومەر بەوشێوەیە چاوی بە عومەیر کەوت...
زۆر سەرسام بووو فەرمووی :

ـ ئەوە چیتە ئەی عومەیر ؟

ـ هیچم نیە ـ ئەی گەورەی موسلمانان ـ سوپاس...
بۆخوا ، لەش ساغ و تەندروستم و مالی دنیام کرتو...
پەکۆلەوە عـــومەر وایزانی مەبەستی لەو خەراج...
دەستهاتەیە کەهێناویەتی بۆخەزانەی دەولەت...
بۆیە فەرمووی :

ـ لەمالی دنیا چیت پێیە ؟

ـ توێشووەکەم پێیە گەلانی تێ ئەخەم ، وەتاپی...

ەکەم کەتیایا نەخۆم و سەرم و جلەکانمی پێ نەشۆم
ەوەندەی ناویشم پێیە بۆ خواردنەوەودەست نوێژم
جا هەموو مالی دنیا ـ ئەی گەورەی موسلمانان ـ
بریتیە لەمانەی کە لای منە ، لەمە زیاتر نەمن وە
نە کەسی تریش پێویستی پێی نیە . عومەر فەرمووی:
وە ئایا بەپێ هاتووی ؟
ـ بەلێ ، ئەی گەورەی موسلمانان .
ـ ئەی لەوێ ولاغێکیان نەدایتێ تا سواری بیت؟
ـ ئەوان نەیان دامێ و منیش داوام نەکرد .
ـ ئەی کوا ئەوەی هێناوتەتەوە بۆ خەزنەی دەولەت؟
ـ هیچم نەهێناوە .
ـ بۆچی ؟ !
ـ کاتێ کەیشتمە ( حیمس ) ، پیاوچاکەکانم
کۆکردەوەو کاروباری کۆکردنەوەی خەراج و دوستهاتم
پێ سپاردن جا هەرجارێ شتێکیان لێ کۆ نە کردەوە

پرس و رام پێ نەکردن تا لە شوێنی خۆیا داینێتەوە دابەشی کەم بەسەر ئەوانەیانا کە پێویستیان پێی هەیە .

عومەر بە نوسەرەکەی فەرموو :
پەیمانی بەڕێوەبردنی کاروباری حیمس ناوەکەرەوە بۆ عومەیر . عومەیر وتی : تازە ؟ ! .. هەرگیز شتی وام ناوێت ، وە کاربەدەستی نەبۆ تۆو نەبۆ هیچ کەسێ دوای تۆ ناکەم ئەی گەورەی موسلمانان !
ئینجا ماوەی لە خەلیفە وەرگرت ئابچێتەوە بۆ یەکێ لە دێکانی دەوروبەری مەدینە کە مال و منالەکەی لەوێ بوون .

- ٣ -

بەڵێ ، عومەیر خۆی لە کاربەدەستیتی دامالی و گەڕایەوە ناو مال و منالی خۆی .. بەڵام هێشتا عومەر هەر وازی لێ ناهێنێ ، تا بەجوانی تاقی

ئەکاتەوەو پاکی و ڕاستی ئەوی بۆ دەرئەکەوێ ...
لەلایەکی ترەوە کێ ئەڵێ لەماوەی ئەم ساڵەدا
عومەیر چاك خۆی نەگرتووە ، وا بێدەنگ چووەوە
ماڵی خۆیەوە ؟ ئادەمیزادەو شەیتان هەمیشە
خەریکیەتی بۆ فریودان ، بۆیە زۆری پێ ئەچوو
فەرمانی دا بەیەکێ لەپیاوە باوەڕ پێکراوەکانی
کەناوی ـ حارث ـ بوو :
ـ ئەی حاریس بڕۆ بۆ ماڵی عومەیر کوڕی
سەعد ، خۆت بکە بە میوانی ، جا ئەگەر خۆش
گوزەرانیت پێیانەوە دی ، چۆن چوویت وەهاش
بگەڕێرەوە ، وەئەگەر دەست کورتیت پێیانەوە دی
ئەم پارەیەی بدەرێ .
ئینجا کیسێکی دایە دەست کە سەد دیناری
تیابوو ، حاریس مەدینەی بەجێ هێشت و بەرەو ئەو
دێیەی کە عومەیری تیا بوو کەوتە ڕێ ، هەواڵی

پرسی و پیغانیان‌دا .

کاتێ چاوی پێ‌کەوت وتی : السلام علیك ورحمة الله . عومەیر وتی : وعلیك السلام ورحمة الله وبركاته .. لەکوێوە هاتوویت ؟

ـ لە مەدینەوە .

ـ موسلمانەکانت چۆن بەجێ هێشت ؟

ـ بە چاکی .

ـ گەورەی موسلمانەکان چۆنە ؟

ـ لەش ساغ و پیاوچاکە .

ـ ئایا فەرمانی خوا جێ‌بەجێ ئەکا ؟

ـ بەڵێ ، دارێ حەددی دا لە کوڕێکی خۆی لەسەر هەڵسانی بەکارێکی پیس ، تا لەژێر لێدانا مرد .

ـ خوایە یارمەتی عومەر بدەیت ... من وای لێ تێ ئەگەم کەتۆی زۆر خۆش ئەوێت .

ـ بەڵێ لە کۆمەڵگەی موسلماندا ، موسلمانانی

هەموو هۆشیارن .. هەموو چاوکراوەن .. کوێرانە شوێنی هیچ کەس ناکەون ، تەنها شوێنی خواو پێغەمبەر ئەکەون ... وە لەوان بەولاوە بەپاکی و بێ‌کەردی هیچ کەس باوەڕیان نیە . بۆیە چاودێری هەموو کەسێ ئەکەن .. ئەترسن شەیتان بیخەڵەتێنێ ئەوەی زۆر شارەزایەو زۆر زانایە ، ئینجا مەترسی لادانی لێ ئەکرێت . جا وەك عومەر لە عومەیر ئەترسێ لابدا ، عومەیریش ئەترسێ عومەر لابداو باوەش بکا بەژیانی دنیاداو موسلمانەکانی لەبیر بچێتەوە ؛ بەڵام ئەبێ ئاکاداربین ئەمە دڵپیسی ناکەیەنێ ، بەڵکو کەورەیی و کرانی سپاردەکەیان لاکرنکە .. خۆشەویستی ئیسلامە لەدڵیانا کە هەمیشە لەهەموو کاربەدەستێك ـ کەورە بێت یابچوك ـ ئەترسن لابدات . چونکە هەرکیز عومەرو عومەیر هیچ کامیان خۆی لەوی‌تر بەچاکتر نەئەزانی . . ئەمەش وا

لەموسلمانەکان ئەکا تا پیاوی ئایینی لەئیسلاما دروست نەبێو کۆمەڵو پیرو پشتگیر دروست نەبێ ، وە تا هەموان مل کەچی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوابن ..

حاریس سێ شەو لە مالی عومەیر بە میوانداریەوە مایەوە ، هەموو شەوێ کولێرەیەکی جۆیان ئەداین تابیخوات ..

بۆ ڕۆژی سێهەم ، پیاوێك کە ئاگاداری وەزعی مالو حالی عومەیر بوو بەحاریسی وت : بـــەم مانەوەیەت زیانت کەیاند بە عومەیرو خێزانەکەی ، چونکە تەنها ئەو کولێرەیەیان هەیە لەدەمی خۆیانی ئەکرنەوەو دەرخواردی تۆی ئەدەن .. بە ڕاستی برسێتیو ماندوویی تەنگاوی کردوون ، جا ئەگەر بە چاکی ئەزانی حەزئەکەم واز لەوان بێنیو بێیتە لای من ..

کاتێ حاریس بـۆی دەرکەوت عومەیرو مالو

منالی چۆن ئەژین ، پارەکەی خەلیفەی دەرهێناو داى بەعومەیر ... عومەیر وتی :

ـ ئەمە چیە ؟

ـ کەورەی موسلمانان بۆتی ناردووە .

ـ بیبەرەوەو سەلامی منی پێبکەیەنەو پێی بلێ :

عومەیر وتی : پێویستیم پێی نیە .

بەلێ عومەیر چاوەڕوانی پاداشتی پەروەردکارە بەوحالە ئەژیء خۆی وادائەنێ کە زۆر دەولەمەندەو پێویستی پێی نیە ..

خێزانەکەی ـ کەنموونەی ئافرەتی موسلمانی تێکەیشتوو بوو ـ کوێی لەم وتوویژەی نێوان مێردەکەیو میوانەکەیان بوو .. بۆیە دەنکی هەلبڕیو وتی :

وەری کرە ئەی عومەیر ، ئەکەر پێویستیمان پێی هەبوو ئەوا خەرجی ئەکەیت ، ئەکەر نا بۆ ڕێکای

خۆی خەرجی ئەکەیت . چونکە لیرە دەست کورتو هەزاران زۆرن ..

کۆمەڵکەی موسلمان هەموو ئەندامێکی چاوکراوەیە. هەموو ئەندامێکی تێ‌گەیشتووو شارەزایە بۆیە بە هەموو شێوەیەك مەبەستیان ڕەزامەندی خواو سەرفرازی ڕۆژی دواییە .

خێزانەکەی عومەیر یەکێکە لەو ئافرەتانەی بەهەموو شێوەیەك پشتگیری ئیسلام ئەکەن .. یەکێکە لەو ئافرەتانەی کەشان بەشانی پیاوان بەشداری جیهادی ئیسلامی ئەکەن پیاوان لەمەیدانی جەنگاو ئافرەتانیش لەماڵا پەروەردەی خۆیانو کۆرپەکانیان ئەکەن .. پیاوان بەرامبەر بەدوژمنی خوانەناس دان بەخۆیانا ئەگرنو ئافرەتانیش بەرامبەر بەشەیتانو ئارەزووی دەروون دان بەخۆیانا ئەگرنو هەتا بەگولێرەیەکی جۆ ، بۆ هەموو ڕۆژێکی خێزانێك

ئەسازن .. خۆ ئەگەر میوانێك رووی تێ کردن ئامادەن لەدەمی خۆیانی بۆ بکرنەوەو دەرخواردی میوانی خۆشەویستی بدەن ..

تەنها لەکۆمەڵگەی ئیسلامیا ئەمە بەرەزامەندیەوە ئەکرێت .. وە تەنها موسلمانەکان بەژنو پیاوەوە بەم شێوە بێ هاوتایە دان بەخۆیانا ئەگرنو بەژیانی تاڵ ئەسازن ، تاخوا ئاورێ بداتەوە بەلایاناو دوای ئەوە بەسەربەرزیەوە لەتاقی کردنەوە دەرئەچن ..

کاتێ حاریس وتەی خێزانەکەی عومەیری بیست پارەکەی خستە بەردەست عومەیرو هەڵسا خوا حافیزی لێ کرد .. عومەیریش پارەکەی هەڵگرتو دابەشی کرد بەسەر چەند توورەکەیەکداو ئەو شەو نەخەوت هەتا هەمووی بەخشیەوە بەسەر دەستە کورتەکاندا ، بەتایبەتی منالی شەهیدەکانی رێگەی خوا .. کەمرۆڤ لێبڕا بۆخوا هەموو چاکەیەکی لێ

دیّو بەلایەوە ئاسان ئەبێت .. وە بەرژەوەندی تایبەتی بەجارێ لەبیر ئەچێتەوە .. لەلایەکی ترەوە کۆمەلکەی موسلمان تەنها بەپیاوان تەواو ناکرێت‌و دانامەزرێت ، چونکە نیوەی ئافرەتە .. ئافرەتێك لەشەوو ڕۆژێکا یەك کولێرەی جۆی هـــەیە بۆ دەرخواردنی خۆی‌و خێزانەکەی ، وا سێ ڕۆژە ئەو خۆراکەش پێش کەش ئەکا بەمیوانەکەیان‌و خێزانەکە بەبرسێتی ئەمێنێتەوە .. وە وا لەلایەن خەلیفەوە سەد دنیاریان بۆ هاتووەو بەهاوبەشی مێردەکەی ئەیبەخشنەوە بەسەر خێزانە هەژارەکانا ..

چا کێ لە خۆیان هەژارترە ؟

تەنها خۆنەویستنە ..

تەنهـــا ڕەفتاری بەرزو پیرۆزی پیاوانەو ئافرەتەکانیشیان چاویان لێ کردونو بونەتە نمونەی خەباتو کۆششی بێوچان تا کۆمەلکەی ئیسلامی

لێناڵی سەخت بەردەمی ببڕێو بتوانێ ئادەمیزاد
رزگار بکا ...

* * *

حاریس گەڕایەوە بۆ مەدینەو خەلیفە عومەر
لێی پرسی :

ـ چیت دی ، حاریس ؟
ـ تەنگاویەکی زۆر ئەی گەورەی موسلمانان .
ـ ئایا پارەکەت دایە ؟
ـ بەڵێ ، ئەی گەورەی موسلمانان .
ـ جا چی پێ کرد ؟
ـ نازانم . بەڵام بێ گومانم کەوا تاقە
درهەمێکی بۆ خۆی ناهێڵێتەوە .

جا عومەر نووسی بۆ عومەیرو فەرمووی :
ـ ئەگەر ئەم نامەیەم گەیشتە لات بەرلەوەی
دای بنێیت بەپەلە خۆت بگەیەنەرە لام ..

عومەیر بەرەو مەدینە گەڕایەوەو چووە لای گەورەی موسلمانان .. عومەر بەخێرهاتنێکی گەرمی کردو لەخۆی نزیك کردەوە ، ئینجا فەرمووی :

ـ چیت کرد بەپارەکە ئەی عومەیر ؟

ـ جـــا تۆ چیت حاوە لێی ، دوای ئەوەی ناردووتە بۆ من ، ئەی عومەر ؟

ـ حەز ئەکەم مەولام بدەیتێ بزانم چیت پێ کردووە .

ـ پاشەکەوتم کردووە بۆ خۆم تا لەڕۆژێکا کە ئەمال و ئەمنال بەکەلك نایەت کەلکی لێ وەرگرم..

بە وتەکەی عومەیر ، دڵی عومەر هاتـــە جۆش و فرمێسك لەچاوی هاتە خوارەوەو فەرمووی :

ـ شایەتی ئەدەم کەتۆ لەوانەیت کە لەگەڵ پێویستی بوونیانا خۆیان لەبیر ئەچێتەوە .

ئینجا فەرمانیدا تا باری وشترێ خواردەمەنی و

دوو کراسی بدەنێ ،

هومەیر وتی :

بەلأم خواردەمەنیەکە ، پێویستیمان پێی نیە ، ئەی کەورەی موسلمانان ، چونکە دوو مشت جۆم لەلای منالەکانم بەجێ هێشتووە ، تا ئەوە ئەخۆن ، خوای کەورە ڕۆزی ترمان بۆ ئەنێرێ ، وە بەلأم دووکراسەکە ئەبەم بۆ خێزانەکەم چونکە کراسەکەی ڕزیوەو وەختە لەشی دەرکەوێ .

خوایە سوپاس بۆتۆ کە ئەم ڕێبازە شیرینەت بۆ ناردوین ..

بەڕاستی هەر کۆمەلێ لەسایەی قورئانا بژی ، ئارامیو هێمنیو سنك فراوانی ئەڕژێ بەسەریا ، چاوی لە ڕابواردنی دنیا نیە ، وە ئەوەندەش هەوڵ بۆ ڕۆژی قیامەت ئەداتو خۆی بۆ ئامادە ئەکات وخەمی ئاینەکەی ئەخوات ، یەکێ وا ئەزانێ ژیانی لەبیر

چۆنەوە، گەچی لەڕاستیدا واش نیە ، بەڵام لێ بوردنە وای لێ ئەکات . هەموو ئەندامێکی لەهەموو کەس زیاتر حەزی لە خۆشیو رابواردنی قیامەت زۆر جیاوازنو رێژە نیە لە نێوانیاندا بۆیە بۆ خۆی واز لەم دێنیو دەست کرۆیی ئەندامەکانی تر ئەکات ...

لەلایەکی ترەوە کۆمەڵی قورئان پێویستی بەخەباتو خۆنەویستنو دەستپێوەکرتن هەیــــە ، لە ڕەپلازە شیرینەکە لەژیانی رۆژانەدا بچەسپێنی .. بۆیە ئەندامە دڵسۆزەکان دەست ئەنێن بە ڕووی ئارەزووەکانیانەوە تا کونو کەلەبەری تری کۆمەڵی پێ بکرن ، ئەو خواردەمەنیەی کەوەیر کلی ناداتەوە کە کوایە دوو مەت جۆری مەیە لەماڵەوە، ئەبێ بدرێ بە داماوێکی تر . کێ ئەڵێ کاورێك وەیا جوولەکەیەکی بــــێ دەسەڵات کەڵکی لێ وەرناگرێ ، کەوا لەسەر حکومەتی ئیسلامـی

پێویستە چاوی لێ بێت ؟!

لەلایەکی ترەوە مەرج نیــە هەموو ئەندامێکی کۆمەلی ئیسلامی بەهەژاری ژیانی دابێتە سەر ، وەبەلکو زۆر لەموسلمانەکان ـ کە خەریکی بازرگانی بوون وە یا زەوی‌و زارو باخ‌و بێستانیان هەبوو ـ زۆر دەولەمەند بوون . وە هەرچەندە بەراست‌و بەچەپ لەرێی خــوادا ئەیان بەخشی‌ ، لەگەل ئەوەشا خۆیان ژیانێکی خۆشیان ئەدایە سەرو زۆری سامانیشیان لەوەدا ئەبوو ...

* * *

ئەم بەیەك کەبشتەی عومەرو عومەیر زۆری پێ نەچوو هەتا خوای گەورە ویەق وابوو عومەیر کوری ســەعد بکاتە خزمەتی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی‌و لــە بەهەشتی بەرینا بەدیداری شادبێتەوە ...

عومەیر سەرزەوی بەجێهێشت و بەرێگای خۆشەویستانی خوادا بەرەو ژیانی نەبراوەی هەتامەتایی کەوتەڕێ ... بەباری سووك و ویژدانی حەساوەو دەروونی فراوانەوە ، بەرەو بارەگای پەروەردکار بەدڵێکی ساف و بێگەردەوە کەوتە ڕێ..

بەڕۆیشتنی عومەیر کورسیەکی ئەندامانی کۆمەڵکەی ئیسلامی چۆل بوو ... ئەندامێکی خۆشەویست و دڵسۆزو بەغیرەت و بەوەفای کۆمەڵکەی ئیسلامی کۆچی کردو ژیانی پڕمەینەت و سزاو ئازاری بەجێهێشت .. بەرەو ژیانی پڕخۆشی و کامەرانی هەتا هەتایی بەهەشتی پەروەردکار ..

کاتێ ئەم هەواڵە گەیشتە عومەر کوڕی خەتتاب زۆر زۆر بەلایەوە ناڕەحەت بوو ، بەڵام چارچیە ، ئەمە ڕێگای هەموانە ، بەڵام خۆزگەم بەوەی بەڕوومەتی گەشاوەوە بەدیداری پەروەردکار شاد

رفيق احمد محمود

ئەبێتەوە . جا عومەر فەرموی :

« ئاواتەخواز بووم پیاوانی وەکو عومەیر کوڕی سەعـــدم ببوایە تـــا لەهەڵسوڕاندنی کاروباری موسلمانانندا یارمەتیم پێ بدەستنایە » .

بەڵێ عومەیری دڵسۆزو ڕاستکۆ لەگەڵ ئایین و بیروباوەڕەکەیا هەموو شوێن پێیەکی هەر نیشانەی مەردایەتیو جوامێریو پیاوچاکی بوو ، چونکە بەڕاستی لەقوتابخانەکەی قورئانندا خـــۆیو دڵو دەروونی پەروەردە کردبوو .

خوا لێی ڕازی بێت .

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين